زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان        ئەلقەی بیستەم

# گەنج و قەیرانی ڕووحیی



هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر



عەلی باپیر

التفسير



# گەنج و قەیرانی ڕووحیی


**نوسینی**

عەلـی بـاپیر

**بڵاوکردنەوەی**

نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

**نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ**

زەردەشت کاوانی

**خـەتی بـەرگ**

نـەوزاد کـۆیـی

**قـەبـارە**

١٤× ٢١ - ( ٥٤ ) لاپەڕە

**نۆرە و ساڵی چاپ**

یەکەم ١٤٣٨ ک - ٢٠١٧ ز

**تـیراژ**

١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردنی ( ٤٩ ) ی ساڵی ٢٠١٧ی پێدراوە





**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس

/TafseerOffice

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ئەلقەی بیستەم

# گەنج و قەیرانی ڕووحیی

## هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر

نوسینی

عەلی باپیر



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ ... إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا
عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن
نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا .. ﴿١٤﴾ ﴾ الكهف

# پێشکەش بێ

بەو گەنج و لاوانەمان - لەکوڕان و کچان - کە وێڕای جەستەیان ئاگاداری ڕووحیشیانن و، دەزانن، کە توێکڵ بۆ کاکڵ چۆنە، جەستەش بۆ ڕووح هەرواریە و، دڵنیاشن، کە وەك چۆن مایەی گەشەکردن و بەردەوامبوونی جەستە، ئەو خۆراکەیە، کە لە زەمین دایە، مایەی ژیان و مان و ساغ و سەلامەتیی و ئارامیی و ئۆخژنی گیان (روح)یش: خواناسیی و خواپەرستیی و یادی خوایە.



# ئەم نامیلکەیە

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه، من الصَّحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسانٍ إلى يوم اللقاء.

**خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!**

ئەم نامیلکەیەی بەردەستت، دەقی وتارێکە کە لەکۆڕێك دا، لەشاری ڕانیە لەلایەن بەندەوە دراوە، بەهەمان ناوونیشان: {گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر}، لەڕۆژی: (٢٠١٦/٨/٤)دا، شایانی باسە، کۆڕەکەش لەلایەن ڕێکخراوی: (هزری هاوسەنگ)ەوە سازکرابوو، بەهاوکاریی مەڵبەندی پێنجی کۆمەڵی ئیسلامیی.

هیواداریشم ئەم نامیلکەیە، مایەی بەرچاو ڕوونیی و دامەزراویی گەنج و لاوەکانمان بێ، لەڕووی مەعنەویی و ڕەوشتییەوەو، هۆکاری چارەسەری ئەوانەشیان بێ، کە گیرۆدەی ئەو نەخۆشییانە بوونە، کە لە قەیرانی ڕووحیی و بۆشایی مەعنەوییەوە پەیدادەبن.

هەڵبەتە مرۆڤیش بەر لەجەستە و ڕواڵەتی، بە ڕووحی و دیوی پەنهانی، مرۆڤە، وەك شاعیرێك گوتوویەتی:

علیك بالروح فاسْتَكْمِلْ فضائلها
فأنت بالروح لا بالجسم إنسـانُ

واتە: ئاگاداری ڕووحت بە، بەخەسڵەتە پەسندەکانی بیڕازێنەوەو کامڵیان بکە، چونکە تۆ بە ڕووحت مرۆڤی، نەك بە جەستەت.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهدُ أ لاّ إله إلاّ أنت، أشتغفرك وأتوب إليك.

نووسەر

https://www.youtube.com/watch?v=IGCXBob1h-A&t=797s
www.youtube.comalibapir1
www.facebook.com/alibapir

# ڕێ خۆشکردن

ئەم نامیلکەیە لە (دەستپێک)ێک و سێ بەش پێکهاتوە، کە لە (دەستپێک)ەکەدا، چەمك و واتای هەرکام لە:

١- گەنج و لاو.

٢- قەیران.

٣- قەیرانی ڕووحیی.

شیدەکەینەوە و ڕوون دەکەینەوە.

**لە بەشی یەکەمدا:** (هۆکارەکانی قەیرانی ڕووحیی)، لە حەوت خاڵاندا، باسی هۆکارە سەرەکییەکانی قەیرانی ڕووحیی و ڕەوشتیی گەنج و لاوەکانمان، لەهەرێمی کوردستاندا دەکەین.

**لە بەشی دووەمیشدا:** (شوێنەوارەکانی قەیرانی ڕووحیی)، لە دە (١٠) خاڵاندا شوێنەوارە بنەڕەتییەکانی قەیرانی ڕووحیی، لەهەرێمی کوردستاندا، دەخەینەڕوو.

**لە کۆتاییدا، لە بەشی سێیەمدا:** (چارەسەر) لە سێ خاڵی سەرەکییدا، باسی هۆکارو ڕێیەکانی چارەسەرکردنی قەیرانی ڕووحیی دەکەین.

**لێرەشەوە وەك ئاگربڕێك دەڵێم:** بێگومان ئەم بابەتی قەیرانی ڕووحییە، زۆر زیاتر هەڵدەگرێ قسەو باسی لەسەربکرێ، بەڵام لێرەدا لەوە زیاتر دەرفەت نەبوو، هەڵبەتە هەرکام لە کتێبەکانی:

١- (ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون).

٢- (گیانی ژیان).

٣- (گەڕانەوە بۆ لای خوا).

بەرچاو ڕوونیی و زانیاریی زۆرو جۆراوجۆریان تێدایە، لەبواری ڕووحیی دا و، پێم وایە: دەگونجێ چارەسەری گەلێك گرفت و دەردو نەخۆشییان لەو بوارەدا، لێ وەربگیرێن.



# دەستپێك

**بــەڕێــزان!**

هەوڵدەدەین ئەم بابەتە: (گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر) لە سێ تەوەردا شی بکەینەوە، هەرچەندە بابەتەکە تەرخان کراوە بۆ توێژی گەنجان و لاوان، بەڵام لە ڕاستییدا، هەموو لایەك بە پیرو گەنج و نێر و مێ وەو، بە وردو درشتەوە، بە بەرپرس و خەڵکی دیکەوە، دەگونجێ تووشی قەیران و بۆشایی ڕووحیی ببن، بەڵام بە حوکمی ئەوەی ئەو قەیرانە، زۆرتر چینی گەنجانی گرتۆتەوە و، هۆکارەکانی دروستبوونی ئەو قەیرانە، زۆرتر کار لەگەنج و لاوان دەکەن، بۆیە زۆرتر باسی گەنج و لاومان کردوە.

**سەرەتاش تیشك دەخەینەسەر چەمك و واتای هەرکام لە وشەکانی: گەنج، قەیران، قەیرانی ڕووحیی:**

١- گەنج و لاو، بەعەرەبی: (شاب، شابة) یان (فتی، فتاة)ی پێ دەڵێن، گەنجێتیی قۆناغێکی زۆر هەستیارە لە تەمەنی مرۆڤدا، کە زۆربەی زانایان، ئەگەر نەڵێم هەموویان دەڵێن: تەمەنی گەنجیی

لە باڵغبوونەوە، لە تەمەنی پازدە (١٥) ساڵییەوە دەست پێدەکات و، هەندێکیان دەیگەیەننە تەمەنی بیست وپێنج (٢٥)، یان سی (٣٠) ساڵیی، هەندێکیشیان دەیگەیەننە چل (٤٠) ساڵییش، بەڵام هیچیان لە (٤٠) یان تێنەپەڕاندوە.

ئنجا لە دوای (٤٠) ساڵیی، قۆناغی کامڵ بوون و کەوتنە تەمەن و پیربوون، دەست پێدەکات. بەڵێ بەڕاستیی ئەو قۆناغە زۆر هەستیارە و، ئەوانەی کەوتوونە تەمەنەوە، دەزانن گەنجیەتیی چەندە قۆناغێکی گرنگ و بایەخدارە.

قۆناغی گەنجیەتیی، قۆناغی بنیاتنانی کەسایەتییە، چ کەسایەتییەکی ڕێك و ڕاست و تەندروست، چ کەسایەتییەکی لار و خوارو نەخۆش.

(عطاءُاللّه)ی ئەسکندەریی، کە یەکێکە لە عاریفە گەورەکان، قسەیەکی جوانی هەیە دەڵێ: (مَنْ لَم تَكُنْ لهُ بِدايةٌ مُحرقة، لاتكونُ له نهاية مُشرِقة). واتە: هەر کەسێ سەرەتایەکی گەرم و سووتێنەری نەبێ، کۆتاییەکی ڕۆشن و پڕشنگداری نابێ.

ئنجا دیارە هەم ئەوەی، کە گەنجە، پێویستە ئاگاداری خۆی بێ، هەم دایك و باب و خێزان، دەبێ ئاگایان لە منداڵەکانی خۆیان بێ. لە هەمووشی گرنگتر قۆناغی منداڵییە، پێش قۆناغی گەنجیەتیی، پێویستە ئەو قۆناغەیان بەشێوەیەك بگوزەرێنن، کە کەسایەتییەکی ڕێك و ڕاست بنیات بنێن، بۆئەوەی لە هەموو قۆناغەکانی دیکەی ژیانیاندا، بەشێوەیەکی ڕێك و ڕاست ڕێبکەن.

**شتێکی ئاشکرایە مرۆڤ، لە دوو لایەنی سەرەکیی پێکهاتوە:**

**یەکەم: جەستەیەك، کە لە خاك دروستبووە و وەرگیراوە.**

**دووەم: ڕووحێکیش، کە لەخواوە هاتوە، واتە شتێکی ماددیی نیە.**

بەڵام هەر دروستکراوی خوایە، ئنجا زانایان دەڵێن: جەستەی مرۆڤ لەعالەمی (خلْق)ە، بەڵام ڕووح لە عالەمی (أمر)ە، دیارە هەردووکیان هەر مەخلووقن، بەڵام مەبەستیان زیاتر ئەوەیە، کە عالەمی خەلق، بەپلە پلە (تدرُّج) دروست دەبێ، بەڵام عالەمی ئەمر، بەو شێوەیە نیە، ئێمە دەزانین جەستەی منداڵ لە سکی دایکیدا، یەکەمجار (نطفة)و دواتر (عَلَقَة)و دواتر (مضغة)یە، کە قۆناغ قۆناغە، وەك خوا باسی کردوە[1]، زانستیی کۆرپەلەزانیی (علم الأجنَّة) دەریخستوە، دواییش لە دایك دەبێ و، دواتر قۆناغەکانی دیکە دەبڕێ، واتە: منداڵیی و گەنجیی و کامڵ بوون و پیریی. بەڵام ڕووح نازانین چۆن دروست بووە؟ بۆیە زانایان دەڵێن: ڕووح لە عالەمی ئەمرە، بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا دروست بووە، نەك پلە پلە، وەك جەستە.

هەر چۆن بێ، مرۆڤ لەو دوو پێکهاتەیە دروست بووە: جەستەیەك کە لە خاك دروست بووە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ ﴾ طه: ٥٥.

---

(١) ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾ المؤمنون: ١٢ - ١٤

واتە: (لەوێدا دروستمانکردن). یانی: لەو خاکە دروستمان کردوون.

وە فەرموویەتی: ﴿ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴾ ص: ٧١.

واتە: (من دەمەوێ بەشەرێك لەقوڕێ دروست بکەم).

قوڕیش دیارە لە ئاو و گڵە، ئنجا دواتر باسی فوو پێدا کردن دەکات و دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ حجر.٣٠.

واتە: ئنجا هەر کاتێك جەستەکەیم ڕێکخست، وە لە ڕووحی خۆم (یانی: لەو ڕووحەی کە بەس خوا دەزانێ چییە و چۆنە؟ لەو دروستکراوە تایبەتییەی خۆم) فووم بە بەرداکرد (ئەی فریشتەکان)· کڕنووشی بۆ بەرن.

ئنجا بەڕێزان!

وەك چۆن جەستە پێویستیی بەخزمەت هەیە، پێویستیی بەخواردن و خواردنەوە و، جوولە و، پاك ڕاگرتن و، پارێزگاریی لێکردن هەیە، لە سەرما و گەرما و نەخۆشیی، بەهەمان شێوە: ڕووحیش پێویستیی بەخزمەت هەیە، هیچ گومانی تێدانیە، ڕووحیش دەبێ خۆراکی بدرێتێ، دەبێ لەسەر کاری چاکە ڕاهێنانی پێبکرێ، دەبێ بپارێزرێ لە کار و ڕەوشتی خراپ، وە وەك چۆن جەستە نەخۆش دەبێ، بەهەمان شێوە ڕووحیش نەخۆش دەبێ.

**٢- قەیران یانی چی؟**

قەیران بریتیە لە کێشەیەك کە زۆر قووڵ بێتەوەو، پێویست بکات خەڵك بۆی دانیشێ و، بیر لە چارەسەرکردنی بکاتەوە. ئنجا ئێستا ئێمە قەیرانێکمان هەیە بەناوی قەیرانی ڕووحیی، بەڵام ئایا چارەسەری هەیە؟ بەدڵنیایەوە چارەسەری هەیە.

لەواقیعی ئێستاماندا، باسی زۆر جۆرە قەیران دەکرێ: قەیرانی بارگرژیی سیاسیی و، قەیرانیی ئابووریی و، بێ مووچەیی و، قەیرانیی ئەمنیی و... هتد، بەڵام لە بەرپرسانی ئەم وڵاتە نابیستین، ئەوانەی جڵەوی حوکمڕانییان بەدەستەوەیە، تاکو ئێستا نەمان بیستوە بڵێن: ئێمە قەیرانێکمان هەیە، بەناوی قەیرانی ڕووحیی و ڕەوشتیی (الأزمة الروحية والأخلاقية).

**٣- قەیرانی ڕووحیی چییە؟**

مەبەستمان لە قەیرانی ڕووحیی ئەوەیە: کە ئینسان هەست بەوە نەکات ڕووحێکی هەیەو، ئەو ڕووحەش پێویستیی بە خۆراك و پەروەردەکردن و خزمەتکردن و پارێزگاریی لێکردن و مەشق و ڕاهێنان هەیە، هەموو کەسێك دەزانێ، کە جەستەی هەیە و، جەستەکەشی پێویستیی بەخزمەت و خواردن و خۆراك و پارێزگاریی لێکردن هەیە، بەڵام کەم کەس هەیە هەست بەوە بکات، کە ڕووحێکی هەیە و، ئەو ڕووحەش پێویستیی بە خۆراك و خزمەت و ڕاهێنان و چاودێریی کردن هەیە، بەداخەوە، کۆمەڵگای ئەمڕۆی کوردستانیش تووشی ئەو دەردە بووە و،

هەست بە گرنگیی و بایەخیی لایەنی ڕووحیی ناکەن، ئنجا لێرەوە قەیرانی ڕووحیی سەرهەڵدەدات.

هەڵبەتە بەشێك لەقەیرانی ڕووحییش، قەیرانی ئەخلاقییە، بێگومان ئەمەش مانای ئەوە نیەو مەبەستمان نیە بڵێین: هەموو خەڵکی کوردستان کێشەی ڕووحیی و ڕەوشتییان هەیە، بەڵام بێگومان خەڵکێکی زۆر هەیە ئەو قەیرانەی هەیە.

ئنجا ئایا هۆکارەکانی ئەو قەیرانە چیین؟ شوێنەوارەکانی چیین؟ چارەسەری چییە؟

هەرکام لەو پرسیارانە، لەبەشێکی سەربەخۆدا وەڵام دەدەینەوە.



# بەشی یەکەم

## هۆکارەکانی قەیرانی ڕووحیی

هەرچەندە هۆکارەکانی قەیرانی ڕووحیی و مەعنەویی، زۆر و جۆراوجۆرن، بەڵام پێم وایە دەگونجێ لە حەوت هۆکاری سەرەکییدا، کورتیان بکەینەوە:

**هۆکاری یەکەم: دوورییمان لە ئیسلام:**

هۆکاری سەرەکیی بۆ قەیرانی ڕووحیی لەنێو کۆمەڵگای خۆماندا، وەك کۆمەڵگایەکی مسوڵمان، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە لە ئیسلام دوورکەوتووینەوە، بەڵێ مسوڵمانین، بەڵام لە ئاشنا بوون بە ئیسلام، ئیسلامێك، کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، دووریین، کە دیارە هەر ئەوەش ئیسلامە، کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، نەگەرنا ئەوەی زانایەك دەیڵێ، یان موجتەهیدێك گوتوویەتی، یان تەریقەتێك گوتوویەتی، یان مەزهەبێك، یان لایەنێکی سیاسیی ئیسلامیی گوتوویەتی، ئەوە تێگەیشتنی ئەوە بۆ ئیسلام، نەك خودی ئیسلام. ئیسلامێك، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ... ﴾ المائدة ٣.

واتە: (وە ئیسلامم بە بەرنامەی ژیان بۆ پەسندکردوون)، هەر ئەوە ئیسلامە، کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، ئەگەرنا ئەوەی دیکە، هەمووی تێگەیشتنە بۆ ئیسلام و، مومارەسەکردنی ئیسلامە.

دیارە ئەوەی، کە لە قورئان و سوننەتی صەحیحی پێغەمبەردا بەرجەستەیە، پاك و بێ خەوش و بێ کەم و کووڕییە، بەڵام تێگەیشتنەکان بۆ قورئان و سوننەت، شیاوی ئەوەن، کە هەڵەیان تێبکەوێ.

بەڵێ.. هۆکارێکی گەورەی قەیرانی ڕووحییمان بریتیە لەوە، کە وەك پێویست بە ئیسلام ئاشنانین، نە بەڕاستیی لێی تێگەیشتووین، نە چاك پێوەی پابەند بووین، زۆرجار لە کتێبەکانی خۆمدا گوتوومە: ئینسان پێویستی بەدوو شتان هەیە: زانین و توانین، جاری واهەیە شتێك دەزانی، بەڵام نایتوانی، کەسێك دەزانێ جگەرە کێشان زیان بەخشە، بەڵام ناتوانێ وازی لێ بێنێ، مرۆڤ کاتێ تەواو و کامڵ دەبێ، کە هەرچی ئاکاری چاك و پەسندن بیانزانێ، پاشان بشیانتوانێ، لێیان حاڵی بێ و، لە خۆشیدا بیانکاتە حاڵ، هەم شارەزابێ هەم کارابێ، کە ئەهلی تەسەووف و عیرفان لەو بوارەدا پسپۆڕن و، لە هەموو توێژەکانی دیکەش لەو بوارەدا سەرکەتووتر بوون، هەڵبەتە ئەوانەیان، کە پابەند بوون بە قورئان و سوننەت و شەریعەتەوەو، تووشی لادان نەبوونە. بۆچی؟ چونکە ئەهلی تەزکیەو عیرفان تەرکیزیان لەسەر ئەوە بووە، کە ئینسان تەنیا بەوەندە چاك نابێ، شتی چاك بزانێ، بەڵکو دەبێ شتی چاك بشتوانێ، ئنجا تۆ بەعەقڵ شتە باشەکان دەزانی، بەڵام بەچی دەیانتوانێ؟ بێگومان بە دڵ، یانی: ئەو شارەزایی و زانیارییە، دەبێ بێتە نێو دڵ و دەروون و، ببێتە قەناعەتێك و خۆشت بوێ و

پەسند و قبووڵی بکەی، ئنجا پڕاکتیزەی دەکەی.

هەروەك چۆن ئەو دڵە گۆشتینە، خوێن بە هەموو لەشدا دابەش دەکات، بەهەمان شێوە دڵە مەعنەوییەکەش پەیوەندیی بەو دڵە گۆشتینەوە هەیە و، لە دڵە مەعنەوییەکەوە، زانیاریی و شارەزاییەکان دەبن بە ئیرادەیەك و، دابەش دەبن بەسەر هەموو جەستەو، هەموو شانەکان و خانەکانداو، هەموو ئەندامەکانی لەش دەگرنەوە.

شایانی باسیشە: ئەوەندەی من سەرنجم داوە: یەکەمین کەمتەرخەم لە بواری قەیرانی ڕووحییدا، تاکە تاکەی مرۆڤەکان خۆیانن، کە لێرەدا مەبەستمان چینی گەنجە لە کوڕان و کچان، ئەوە زۆر هەڵەیە ئێمە دەستی چەوری خۆمان بە خەڵکی بسڕین و بڵێین: خەتای حکومەت و دەرەوە و ژوورەوەیە، بەڵام خۆمان هیچ خەتامان نیە! بەڵکو بەر لەهەموو کەس، مرۆڤ، کە تووشی نەخۆشیی دەبێ، خەتای خۆیەتی، خوا وادەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ ﴾ الشورى: ٣٠.

واتە: (هەر بەڵایەکتان بەسەربێ، بەهۆی کردەوەی دەستی خۆتانەوەیە). ئنجا ئەگەربێت و ئینسان واش بیرنەکاتەوە، هەمیشە شان لە بن باری بەرپرسیارێتیی دێنێتەدەر و، هەمیشە دەستی چەوری خۆی بەخەڵکی دەسڕێ و، سەرەنجام کەم و کوڕییەکانی وەك خۆیان دەمێننەوە.

**هۆکاری دووەم: ژینگەی نێو ماڵ و خێزان:**

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی خراپیی پەیوەندیی گەنج لەگەڵ خوادا، بریتیە لە: ماڵ و خێزان و دایك و باب، ئنجا خراپیی ئەو پەیوەندییە، لاوازیی ئیمانیەتی بە خوا و فریشتەکانی و بە ڕۆژی دوایی و بە پێغەمبەران و ...هتد، یان هەر نەبوونی ئیمانیەتی.

بەڵێ، ماڵ و خێزان بەرپرسیارییەتێکی زۆر گەورەیان لە ئەستۆ دایە، بۆیە خوا لە سووڕەتی (تحریم)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ... ﴿٦﴾ ﴾ التحريم ٦.

واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان و ماڵ و منداڵتان لە ئاگرێك بپارێزن، کە سووتەمەنییەکەی خەڵك و بەردە).

**هۆکاری سێیەم: ڕۆڵی خراپی میدیا و کاریگەرییەکەی لەسەر گەنجان و لاوانمان:**

ڕۆڵی نەرێنیی و خراپیی میدیا بەگشتی، بینراو و بیستراو و خوێنراو، هۆکارێکی گرنگی دروستبوونی قەیرانی ڕووحییە، لەنێو گەنجان و لاوانماندا، زۆر بەداخەوە دەڵێم: من چووم بۆ زۆر لە وڵاتانی دیکە، تەنیا لەم هەرێمەی خۆماندا - بەتایبەت لە ئاستی بەرپرسان - پێیان شەرمە باسی قورئان و سوننەت بکەن، لەوڵاتانی دیکە، وانیە، بۆ زانیاریتان: لەوڵاتانی دیکە سەرکردەکان باسی دین و

خوا و قیامەت دەکەن، بە داخەوە کەسم نەبینیوە وەك ئەو بەرپرسانەی وڵاتی ئێمە، ئاوا هەست بە جۆرێك لە تێكشكان بكات، هەست بەوە بكات، کە نابێ باسی قورئان و سوننەت و شەریعەت بکەن، نابێ باسی ئایین و لایەنی ڕووحیی و ناسنامەی گەلی خۆی بكات، هەرچی هەڵدەستێتەوە دەڵێ: مسوڵمانم، بەڵام کە لێی ورد دەبیەوە: لە گرنگیی پێدانی گوتاری سیاسیی و، ئینتیمای فیکرییدا، زۆر کەم بەشی ئیسلامی تێدا دەبینی.

دەبێ ڕاگەیاندن زۆر هۆشیاربێ، چونکە ڕاگەیاندنە، کە بیروبۆچوون و قەناعەتەکان لە دڵ و مێشکی خەڵکدا دروستدەکات، کەچی بەداخەوە، زۆربەی ڕاگەیاندنی ئێمە - کەمەبەستم ڕاگەیاندنی دەنگ زاڵی سیکۆلاریستە- لە چوارچێوەی جەستەدا دەخولێتەوە، کەناڵەکان زۆربەیان بە زۆریی باسی خواردن و خواردنەوە و، جل و بەرگ و، کەلوپەلی نێومال دەکەن.

**هۆکاری چوارەم: ڕەوتی حیزبە عەلمانییەکان:**

ئەو ڕەوتەی، کە حیزبە عەلمانییەکان گرتوویانە بەر، بۆتە هۆکارێك بۆ دروستبوونی قەیرانی ڕووحیی، ئیدی وای لێهاتوە، هەر کە باسی ئیسلام دەکرێ، دەڵێن: یەزیدیی و مەسیحیی و کاکەییش هەن، بەڵام ئایا ئەگەر دیموکراسی (حوکمی خەڵك)یش پێوەر بێ، میللەتێك ٩٥٪ مسوڵمان بێ، هەندێك یەزیدیی و هەندێ مەسیحیی و هەندێ کاکەیی، دەبێ حیسابت لێ تێکبدات و، لەبەر موراعاتی ئەوان، بێگانەتیی لە ئیسلامی خۆت بکەی..!!

بەڕاستی شتێکی سەیرە! باشە، با هەر کەسە بەقەدەر خۆی حیسابی بۆ بکرێ، من لەگەڵ ئەوەدام هەرکەسە وەك خۆی ڕێزی لێبیگرێ، خوا فەرمویەتی:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾ البقرة: ٢٥٦.

واتە: تۆبزیی کردن و ناچارکردن لە ئاییندا نیە، بەڵام هەرکەسە بەپێی خۆی، مسوڵمانان چەندن و ڕێژەیان چەندە؟ با ئەوەندە گرنگییان پێبدرێ و، ئایین و عەقیدە و کلتوورییان بخرێتە بەرنامەی خوێندنەوە، هەرکەسە بەئەندازەی خۆی، با کەمینە ئاینیی و فیکرییەکان، زوڵمیان لێ نەکرێ و زوڵمیشیان بۆ نەکرێ.

**هۆکاری پێنجەم: باڵادەستیی شارستانیی ماددیی:**

شارستانیی ماددیگەریی، کە بەسەر دنیای ئێستادا زاڵە، من ناڵێم: شارستانیی خۆرئاوا، چونکە ئێستا ڕۆژهەڵاتیش وەك ڕۆژئاوا، هەمان ئەو بیرۆکە ماددییانەی، کە سەرەتا لە ئەورووپا سەریانهەڵدا، لە لایەن هەموو دەوڵەتانەوە تەبەنیی کراون، وەك دابڕان لە خوا و لە بەها ڕووحییەکان و، لە ڕۆژی دوایی.

ئەو شارستانییەتە، کە تەنها چاوچڕدەکاتەوە لەسەر جەستە و ژیانی دنیا و تێرکردنی غەریزەکان، ئەو شارستانییەتەی، کە وەك ئاژەڵ سەیری مرۆڤ دەکات، وە وەك تەنیا لایەنە ماددییەکەی، تەماشای ژیان دەکات و، حیساب بۆ لایەنی ڕووحیی ناکات و، حیساب بۆ قیامەت و ڕۆژی دوایی ناکات و، حیساب بۆ خوا و وەحی ناکات،

کە ژیانی ئینسان ڕێکبخات و، حەڵاڵ و حەڕامی بۆ دیاریی بکات و، سنوورەکانی بۆ دیاریی بکات، بەڵێ.

ئەو تێڕوانینە ماددیگەرایییەی هەڵقوڵاوی ئەورووپاش، یەکێکە لە هۆکارەکانی قەیرانی ڕووحیی، کە تێیکەوتووین، بەتایبەت چینی گەنج، بەدڵنیاییەوە: ئیسلام هیچ گرفتێکی نیە لەگەڵ تێرکردنی جەستە و غەریزەکانیدا، بەڵام بەشێوەیەکی شەرعیی و ڕێك و پێك، ئیسلام دەڵێ: دنیا هەیە، بەڵام قیامەتیش هەیە، خەڵك هەیە ڕازییان بکە، بەڵام خواش هەیە ڕازیی بکە، دەبێ هەرشتەو هەر لایەنە بەقەدەر خۆی گرنگیی پێبدرێ و، هیچیان لەسەر حیسابی هیچیان گەورەنەکرێن و، هیچ کامیشیان بۆ ئەوی دیکە پشت گوێ نەخرێ و، مامەڵەیەکی هاوسەنگ و گشتگیریان لەگەڵ دا بکرێ.

**هۆکاری شەشەم: بێ هێز و پێزیی مەنهەجی خوێندن لە ڕووی ئیمانیی و ڕووحییەوە:**

بەرنامەی خوێندن و ئەو کتێبانەی، کە لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا دەخوێندرێن، بە داخەوە، ساڵ بە ساڵ ئیسلامەتیی تێدا کاڵ دەبێتەوە و، ئایەت و فەرموودەکانی تێدا کەم دەبنەوە و، شتێکی وایە، کە هیچ کەس تامەزرۆیی پێ ناشکێ.

بەرپرسانی ئەم وڵاتە، دەبێ ئەو پرسیارە لەخۆیان بکەن: کە ئایا بەرنامەی خوێندن بۆ کێ دادەنێن؟ وەزارەتی ئەوقاف و یەکێتی زانایان و وەزارەتی خوێندنی باڵا و وەزارەتی پەروەردە، دەبێ هەڵوەستە بکەن: ئەرێ ئێمە میللەتەکەمان چ میللەتێکە؟

ئایا ئێمە لە وڵاتانی سوید و نەرویجین؟! یان لە وڵاتی کوردستانین؟ میللەتەکەی ئێمە چییە؟ مسوڵمانە، یان مەسیحیی یە؟

**هۆکاری حەوتەم: کەمتەرخەمیی نێوەندە ئیسلامییەکان، لە بایەخ نەدانیان بە لایەنی ڕووحییدا:**

کرچ و کاڵیی و کەمتەرخەمیی نێوەندە ئیسلامییەکانیش، کاریگەریی نەرێنیی هەیە بۆ سەرهەڵدانی ئەو قەیرانە، پێش هەموو کەس، لایەنە ئیسلامییەکان بەخۆشمانەوە، کە زیاتر کاری خۆمانمان چڕکردۆتەوە لە بواری کاری سیاسییدا، لایەنە ئیسلامییەکان دەبێ بزانن: هەناوو نێوەڕۆك و کاکڵی کاری ئیسلامیی، بریتیە لەوەی، کە خۆمان و خەڵك وا لێبکەین، زیاتر بۆ خوا بصوڵحێین، ئائەوە نێوەڕۆکەکەیەتی.

پێغەمبەران "علیهم السلام" هاتوون، کە خەڵك بکەنە بەندەی خواو، پێکەوە بیانکەنە تەبا و براو، دادگەرییان لە نێواندا بچەسپێنن.

واتە: دەبێ وابکەین کە خوا لە هەموو کەس و شتێ، بەرزو بەڕێزتر و، خۆشەویستتر و، گەورەتر و، پشت پێبەستراو، سام لێکراوترو، مل بۆکەچ کراوتر بێ.

ئێمە وەك خەڵکی ئیسلامیی، دەبێ دان بەوە دابنێین، کە کەمتەرخەمییمان هەیەو، لەبەرململانێی سیاسیی و سەرگەرمیی بە کاری سیاسیی یەوە، وەك پێویست هەقمان نەداوەتە لایەنی ئیمانیی و ڕووحیی، چ ئەندامانی خۆمان، چ خەڵك و جەماوەر بە گشتی.

پاشان دام و دەزگا فەرمیی و نافەرمییەکان، کە بەحیساب ناوەندێکی ئیسلامیین و، خەم لە ئیسلام دەخۆن، ئەوانیش کەم وکورییان هەیەو، جۆرێك لە کەوتنە ژێر کاریگەریی تەوژمی عەلمانییان، پێوە دیارە.

پاشان تەوژمی سەلەفیی، کە ئەصڵەن من تێبینییم هەیە لەسەر ئەو ناو لەخۆنانە (سەلەفیی)، چونکە ئەوە دیارە پێغەمبەر پێشەوای سەلەفی ساڵح بووە، وە هاوەڵانی بەڕێزی، کاکڵ و جەوهەری سەلەفی صاڵحن، دوایی جیلی دوای ئەوان، شوێنکەوتووان (تابعین)، ئنجا شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان (تابعی التابعین) پێشەوای ئێمەن، وە هیچ کەسێ ناتوانێ بڵێ: مسوڵمانم و بەدوای پێشینی چاکی خۆم ناکەوم، مرۆڤ هەتا بەدوای پێغەمبەر و هاوەڵانی بەڕێزی نەکەوێ، کە خوا دەفەرموێ لێیان ڕازییم، "رضي الله عنهم ورضوا عنه" نابێتە مسوڵمان و، هەتا بەشوێن ئەو پێشەوایانە نەکەوێ، نابێتە مسوڵمان و ڕێی ڕاست ناگرێ، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ ﴾ النساء ١١٥.

واتە: هەرکەس سەرپێچیی پێغەمبەر بکات، پاش ئەوەی ڕێنمایی بۆ دەرکەوتوە، وە ڕێی جگە لەبڕواداران بگرێ، حەواڵەی ڕێبازە (چەوت)ەکەی خۆی دەکەین و، دەیخەینە کڵپەی دۆزەخەوەو، خراپترین سەرەنجامیش لە دۆزەخە.

بەڵام شوێن کەوتنی پێشینەی چاك، بەشیعار و دروشم نابێ، تەنیا بەناو لەخۆنان نابێ، هەزارجار لەسەر پاکەتە خوێیەك بنووسرێ:

هەنگوین، نابێتە هەنگوین و هەر خوێیە، بەڵکو دەبێ بزانین، کە ئەو پێشینە چاکەی ئێمە، عەقیدەیان چۆن بووە؟

عیبادەتیان چۆن بووە؟

هەڵسوکەوتیان چۆن بووە؟

چۆن بۆ خوا صوڵحاوبوون؟

چۆن بۆ خەڵك دڵسۆزبوون؟

چۆن لەگەڵ خەڵك تەبا و گونجاو بوون؟

چەند خۆ بەکەمگر بوون؟

نەك خۆ پەسند و لەخۆڕازیی!!

سەلەفی صاڵحی ئێمە، زۆر خۆبەکەمگر بوون و، قەت ئیددیعای گەورە گەورەیان نەکردوە بەسەر خەڵکدا، کە بە خەڵك بڵێن: بەهەشت بۆ ئێمەیە و جەهەننەم بۆ ئێوەیە!

چونکە ئێستا هەندێ کەس و گرووپ هەن، ئەو ناوە (ناوی سەلەفیی)یان لەخۆیان ناوە، کە لە ڕاستییدا ئەوە جۆرێکە لە ئیددیعاکردن و مەدحی خۆکردن و، موزایەدە کردن بەسەر خەڵکی دیکەدا، کە تۆ بڵێی: من لەسەر ڕێی (سەلەفی صاڵح)م، ئەدی خەڵکی دیکە لەسەر چییە؟!

بەڵێ، شوێنکەوتنی (سەلەفی صالح) خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، مسوڵمانان دەبێ شوێن پێشینی چاك (السلف الصالح) بکەون، بەڵام ئایا لەسەریان پێویستە ئەو ناوە لەخۆیان بنێن؟

نەخێر.. بۆچی؟ چونکە خوا یەك ناوی لە ئێمە ناوە، ئەویش ناوی مسوڵمانانە، وەك فەرموویەتی:

﴿ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَٰذَا ﴾ الحج: ٧٨.

بەڵێ ئێمە یەك ناومان لێنراوە، بۆ ئەوەی کۆمان بکاتەوە، ئەویش ئەوەیە، کە ئێمە مسوڵمانین، یانی: بۆ خوا ملکەچین.

هەروەها ئەهلی تەریقەت و تەصەوفیش، لەوبارەوە هەرکەمتەرخەمن، کە ئەصڵەن ئیشیان خزمەتی لایەنی ڕووحییە و تەزکیەی نەفسە، وەك من لە هەردوو کتێبی: (ڕێگای صالح بوون و بەرەو خواچون) و (گیانی ژیان)دا، کە هەردووکیان لەبارەی تەزکیەی نەفسەوەن، باسم کردوە، بەڵام بەداخەوە زۆرێك لە ئەهلی تەریقەت و تەصەووفیش، شتی زۆریان تێکەڵ بەئیسلام کردوە، وەك شیرك و، شتی داهێنراوو، بەپیرۆز گرتنی هەندێ کەس و، پشت بەستن بە هەندێ خەون و خەیاڵ و حیکایەت، کە دەبوایە پشت بەقورئان و سوننەت ببەستن، وەك دوو سەرچاوەی ڕوونی ئیسلام.

کەواتە: بەگشتی نێوەندە ئیسلامییەکانیش، کرچ و کاڵییان هەیە و، بە ئەرکی سەرشانیان هەڵنەستاون، بۆ ئەوەی کە کۆمەڵگاکەمان بەگشتی و، چینی گەنج بەتایبەتیی، لە ڕووی ڕووحییەوە تێربکەن و، وایانلێبکەن چاك پەیوەست بن بەخواوە و، چاك خۆ بڕازێننەوە بەڕەوشتی بەرز و جوان و، خۆیان بژاربکەن لە سیفەتی خراپ و نزم، بەڵام وەزارەتی ئەوقاف و یەکیەتی زانایان و ...هتد، لەو بوارەدا "بەپێی زانیاریی من" تائێستا شتێکی ئەوتۆیان نەبووە، کە شایانی باس بێ!

## بەشی دووەم

## شوێنەوارەکانی قەیرانی ڕووحیی

قەیرانی ڕووحیی، شوێنەوارو دەرهاویشتەی خراپی لەژیانی تاك و کۆمەڵ دا، زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین بنەڕەتییەکانیان لە دە (١٠) خاڵان دا بخەینەڕوو:

**شوێنەواری یەکەم: بێ ئامانجیی و سەرگەردانیی لە ژیاندا:**

گەنجێك دەبینی، پێی دەڵێی: بۆچی دەژی؟ نازانێ، نازانێ لەکوێ هاتوە و، بۆ کوێ دەچێ؟! وە جیاوازیی لەنێوان حەڵاڵ و حەرام و، چاکەو خراپەدا ناکات، ئنجا سەرگەردانیی و بێ ئاکامیی و بێ ئامانجیی لەژیاندا، یەکەمین دەرهاویشتە و شوێنەواری خراپی قەیرانی ڕووحییە.

ئینسان بەهۆی خواناسینەوە حاڵی دەبێ کە: پێگەو پلەی لەبوون (وجود) (محله في إعراب الوجود)دا، چییە؟ دەزانێ کێ دروستی کردوە و، بۆچی دروستکراوە و، بۆ کوێ دەچێ و، دەبێ چۆن بژی؟!

ئینسان بەهۆی خواناسینەوە، خۆی دەناسێ، هەرکەسێ پەیوەست نەبێ بەخواوە، خۆی لێ ون دەبێ، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ﴾ التوبە ٦٧.

واتە: خوایان لەبیرچوو، خواش فەرامۆشی کردن.

ئینسان، کە خوای نەناسی، خۆیشی ناناسێ و، خۆی لێ ون دەبێ، وە هەر کەسێ خوای فەرامۆش کرد، خواش ئەو فەرامۆش دەکات.

**شوێنەواری دووەم: دڵەڕاوکێ و نائارامیی و خەمۆکیی:**

ئەو دڵەڕاوکێ و نا ئارامییەی تووشی گەنجان دەبێ، بە هۆی ئەو قەیرانە ڕووحییەوەیە، بەتایبەت لەو بارودۆخە پڕ قەیراناوییەی ئێستادا: قەیرانی سیاسیی و ئابووریی و ئەمنیی و بێ قەوارەیی، ئەو هەموو قەیرانانەو قەیرانی ڕووحییشیان بێتە سەر!

هەڵبەتە خەمۆکیی و نائارامیی بۆ ئینسان، نەخۆشییەکی زۆر کوشندەیە، ئینسان هەرچی بیکات بەدڵێکی ئارام و بە ئیرادەیەکی بەهێزەوە بۆی دەکرێ، ئینسان ئەگەر ئیرادەی بەزی، بەرامبەر گرفتەکان، هیچی پێناکرێ.

**شوێنەواری سێیەم: کۆنترۆڵ نەکردن و ڕام نەکردنی غەریزەکان:**

خوای بەرزومەزن ئەو غەریزانەی لەمرۆڤدا داناون، هەریەکێك لەو غەریزانە کاری خۆی دەکات: غەریزەی جنسیی، غەریزەی شت زانین، غەریزەی موڵکایەتیی و شت هەبوون، ئەو غەریزانەی، کە خوا لە مرۆڤدا دایناون، هەریەکەیان ئیشی خۆی دەکات، بەڵام بەهۆی ئیمان و پەیوەندیی لەگەڵ خواوە، ئەو غەریزانە کۆنترۆڵ دەکرێن، ئنجا کە ئینسان قەیرانی ڕووحیی هەبوو، پەیوەندیی لەگەڵ خوادا سست بوو،

بەئەندازەی ئەوەش کۆنترۆڵی غەریزەکانی لە دەست دەردەچێ و دەبێتە کۆیلەی نەفس و ئارەزووەکانی، وەك شاعیرێك گوتوویەتی:

وَمَن أباح النفس ماتهواه        فـإنَّـمـا إلـهُـهُ هـــواه

واتە: وە هەر کەسێك نەفسی چی ویست بیداتێ، بێگومان ئارەزووی خۆی دەپەرستێ.

**شوێنەواری چوارەم: ئالوودەبوون بە عادەتی خراپەوە:**

وەك ئالوودەبوون بە جگەرە و نێرگەلە کێشانەوەو، خراپتر لەوانەش مەی خۆریی و تلیاك کێشان، وە گەلێ شتی دیکە، وەك داوێن پیسیی و، دزیی و، خراپەکاریی و تاوان. ئەوانەش هەموویان دەرهاویشتەی قەیرانی ڕووحیی و دوورییبن لە خوا.

بەڕاستی سەیرە! ئینسان هەتا لە ڕووی مادییەوە پێشدەکەوێ، لە ڕووی ئەخلاقیی و بەهاڕەوشتییەکانەوە دوادەکەوێ، ئێستا پێشکەوتوویی ئینسان لەڕووی ماددییەوە لە ئاستێکدایە کە بە دوگمەیەك خێرو شەڕی دێتە بەردەست.

هەر بۆیەش خوا ئەو هەموو پێغەمبەرانەی ناردوون، دەزانێ، وە زانیویەتی کە بەشەر بەبێ پەیوەندیی لەگەڵ خوادا، ژیانێکی ڕاست و دروستی نابێ و، ناتوانێ خۆی کۆنترۆڵ بکا.

**شوێنەواری پێنجەم: ڕووکردنە بیرۆکەی سەیر و نامۆ:**

بۆ وێنە: حاڵەتی (ئیمۆ)، کە لە نێو هەندێك لەگەنجاندا هەیە، ڕەنگە لێرە کەمتر بێ، ئەو ماوەیەی لە بەغداد بووم (٢٠٠٩-٢٠١٣ز) لە ئەنجوومەنی نوێنەران لە بەغداد، چەند کەسێکیان لەسەر ئەو حاڵەتە کوشتن، کە پێم وایە: کارێکی هەڵەو خراپ و ناڕەوا بوو، چونکە نە سزای ئەو ڕەفتارانە کوشتنە و، نە بەکوشتنیش چارەسەری ئەو نەرێتە هەڵانە دەکرێ.

ئنجا شوێن کەوتنی هەندێ بیرۆکەی دیکە، کە بەهیچ پێوەرێك ئێمە پێویستیمان پێیان نیە، وەك: بوونە مەجووسیی و زەردەشتیی و نەسرانیی و ....هتد.

خەڵك لە ئەورووپا ئەوانەی، کە عاقڵن، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی خۆیاندا، کە خوێندەوار و شارەزان، ڕوو دەکەنە ئیسلام، کەچی ئێستا بەو دوادواییە کەسانێك هەن، ڕوودەکەنە نەسرانییەت و زەردەشتییەت !

ئەوجۆرە کەسانە، ئەو پەندەیان بەسەردا دەچەسپێ، کە دەڵێ: (ماڵان باریان دەکرد، گولە تازە کەپری دروست دەکرد)!

لەلایەکی دیکەوە: سەروسیما گۆڕین، بەجۆرێ، کە نامۆیە بەنەرێتی کورد و ئایینی ئیسلام، جاری وا هەیە ئەوان ـ ڕۆژئاواییەکان ـ عادەتێك ڕەچاو دەکەن، ئەو عادەتە فەلسەفەیەکی لە پشتەوەیە، ئەو هەڵسوکەوتە، کە سیمای خۆی بەشێوەیەك لێدەکات، یان جۆرە بەرگێك لەبەردەکات، یان بەجۆرێ هەڵسوکەوت دەکات، ئەوە ئایدیا و

فەلسەفەیەکی لەپشتەوەیە، بەڵام گەنجی ئێمە، لێرە بەچاولێکەرانە دەیکات و، هەر نازانێ ماناشی چییە؟ هەروا بەکوێرانە لاسایی دەکاتەوە.

**شوێنەواری شەشەم: ئاڵوودەبوون بە تەکنۆلۆژیاوە:**

تەکنۆلۆژیا نیعمەتێکە، خوا بۆ خەڵکی فەراهەم هێناوە، ڕێیەکان نزیك بوونەوە، کات (زمن) بۆ ئێمە کورت بۆتەوە، زانیاریی زۆر بەخێرایی دێتە بەردەستی ئێمە، بەڵام ئەگەر نەزانین چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، دەبێتە جۆرێك لە نەخۆشیی، وەك: (نەخۆشیی ئاڵوودەبوونی تەکنۆلۆژیا)، ئەو گەنجەی شەو ڕۆژ لەگەڵ مۆبایلە، لەگەڵ فەیس بووکە، لەگەڵ ئینتەرنێتە، ئاگای لەهیچ کەس نامێنێ، نەحەقی دایك و باب دەزانێ! نەحەقی براو خوشك دەزانێ! نەحەقی وڵات و کۆمەڵگا دەزانێ! نە ئاگای لەخوێندنەکەی و، نەلەکارو کاسبییەکەی دەبێ.

وە بەهۆی ئاڵوودەبوون بە تەکنۆلۆژیاوە، مرۆڤ دەبێتە کائینێکی سەیرو، وەك ڕۆبۆتێکی لێدێ، ئەوەش لە ئەنجامی قەیرانی ڕووحیی دا، چونکە ئەگەر ئینسان بەخواوە پەیوەست بێ، تەکنۆلۆژیا لە شوێنی خۆیدا و بە مەبەستی خۆی بەکاردێنێ، بەڵام پێوەی ئاڵوودە نابێ، هەموو ژیان و بیرکردنەوەی نابێتە ئەوە.

**شوێنەواری حەوتەم: سەری خۆھەڵگرتن و وڵات بەجێ ھێشتن، بەبێ پاساوێکی ڕاستەقینە:**

زۆرێك ھەن ھەر بە چاولێکەریی، یان ھەیە ھەر لەبەرئەوەی ناتوانێ یان پێی شەرمە لێرە کاربکات، سەری خۆی ھەڵدەگرێ. ئەو وڵاتانەی، کە بۆیان چووم، کابرام بینیوە لە ئەورووپا، کە ھەر خەڵکی وڵاتەکەیە ، شەقامەکەی خۆی خاوێن دەکاتەوە، گەسك لێدەدات، لێم پرسیوە: خەڵکی کوێی؟

گوتوویەتی: خەڵکی ئێرەم، خزمەتی وڵاتی خۆم دەکەم، کە بێگومان ئا ئەوە ڕاستە، نەك خەڵکی بیانیی بێنی کارت بۆ بکات.

بەداخەوە دەڵێم: حیزبە عەلمانییەکان وایان لەو خەڵکە کردوە، پێیان عەیبە لەوڵاتی خۆیاندا کار بکەن، لە حاڵێکدا، کە کار کردن، شەرەفە و ڕێز و حورمەتە.

**شوێنەواری ھەشتەم: ھەموو جۆرەکانی تاوان کردن. وەك: ڕێگریی و دزیی و داوێن پیسیی و... ھتد.**

بەڵێ، بێگومان بێبڕوایی و دوور لەخوایی و بۆشایی ڕووحیی، ڕێی گوناھکاریی و تاوانباریی بۆ مرۆڤ تەخت و ئاچووغ دەکات. وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ ﴾ القيامة.

واتە: مرۆڤ - ی بێبڕوا - دەیەوێ خراپەکاریی بکاتە پیشە. دەپرسێ ڕۆژی قیامەت کەنگێ یە؟!

**شوێنەواری نۆیەم: خۆکوشتن (الإنتحار):**

بەڵێ، هۆکاری سەرەکیی خۆکوشتن (إنتحار) بریتیە لە: دوور لە خوایی و بۆشایی ڕووحیی، چونکە لەئەنجامی ئەوەدا کە مرۆڤ هەست بە دووریی و نامۆیی دەکات بەرانبەر بەخوا، تووشی بێ هیوایی و نائومێدیی و گەیشتنە بنبەست دەبێ، هەروەها بابای بێبڕوا، ماناو ئامانجێك لەژیانیدا نابینێ و ئێستاو ئاینده خۆی، وەك ڕابردووی: تاریك و تەڵەم دەبینێت و، ئەوەش وای لێدەکات، کۆتایی بە ژیانە بێ ماناو ئامانج و بەبنبەست گەیشتووەکەی، بێنێ!!

**شوێنەواری دەیەم: پەڕگیریی ( التطرف):**

کە نەك هەر لێرە، لە سەرجەم وڵاتانی دنیادا، لە ئەنجامی بۆشایی ڕووحییدا ئەو دیاردانە هەن، بۆشایی ڕووحیی وا لەمرۆڤ دەکا، ئەو ژیانە ڕۆتینەی بگۆڕێ، بەڵام ئەگەر لە ڕووی ڕووحییەوە تێر بێ و پەیوەست بێ بەخواوە، دەزانێ، کە ئەرکێکی لەژیاندا هەیە، دەزانێ بۆ شتێك دروستکراوە، ژیانی داهاتووی خۆی هەموو لەبەر چاو تاریك نابێ و، بیر لە شتی خراپ ناکاتەوە.

# بەشی سێیەم

## چارەسەر

خوا عزوجل ڕوو بەدۆزەخییانی پەشێمان، دەفەرموێ:

﴿.. أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾﴾ فاطر: ٣٧.

واتە: ئایا هێندە تەمەنمان پێ نەدان، کە ئەگەر کەسێك ویستبای بیری بکەوێتەوە، بیری دەکەوتەوە؟ وە ئایا ئاگادارکەرەوەشتان بۆ نەهات؟ دە بیچێژن، ستەمکاران یاریدەدەریان نیە.

ئێمە، کە لەم سەر زەوییە داندراوین، سەرەتای تەمەنمان دەزانین: فڵان کەس ئەوەندەی ئەوەندە (ڕۆژی ئەوەندەی مانگی ئەوەندەی، فڵان ساڵ) لەدایك بووە، بەڵام کۆتاییەکەی نازانین، خوای کارزان، کۆتایی تەمەنی هەر کامێکمانی شاردۆتەوە، چونکە ئەگەر کەسێك زانیبای: دوای (١٠) ساڵی دیکە دەمرێ، دەستی لە ژیان شل دەبوون، بەڵام ژیان بەهیواوە جوانە و بەئومێدەوە دەگوزەرێ.

کەواتە: دەبێ بزانین: ئێمە بۆ چی لێرەین و، چۆن دەژین؟

خوا لەڕۆژی دوایی دا بە بێبڕوایانی پەشێمانی نێودۆزەخ، دەفەرموێ: ئایا بایی ئەوەندەم نەژیاندن، کە ئەگەر ویستباتان بیرتان دەکەوتەوە؟!

ئەو ماوە ژیانە، کە هەتا زۆرتر بێ، لێپرسینەوەکەی قورسترە، هەتا لە فەرمایشتی پەیامبەردا هاتوە: (أعذر الله الى امرئ، أَخَّرَ أَجَلَه حتى بلغ ستين سنة) رواه البخاري، واتە: هەرکەسێ خوا تەمەنی گەیاندە شەست ساڵ، هیچ بیانووی بۆ نەهێشتۆتەوە.

**ئنجا ئایا چۆن دەتوانین چارەسەری قەیرانی ڕووحیی بکەین؟**

**دەڵێین:** قەیرانی ڕووحیی بە پێچەوانە بوونەوەی هۆکارەکانی، چارەسەر دەکرێ، قەیرانی ڕووحیی بەهۆی دوورکەوتنەوە لە خوا و، لە ئیسلام و، لە بەها ڕووحییەکان و، لەوەی کە نەزانی بۆچی درووستبووی و، بۆ کوێ دەچی و، دەبێ چۆن بژی؟ دێتەدی.

کەواتە: بە پێچەوانەی ئەوانەش چارەسەر دەبێ:

**چارەسەری یەکەم: بوونناسیی ڕاستەقینە:**

بوونناسیی واتە: لە خۆمان حاڵی بین، کە ئێمە چین؟ خوا دەفەرموێ:

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴾ المؤمنون: ١١٥.

جا لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: ئەو هەمزە(أ)یە پێی دەگوترێ: هەمزەی (ئیستفهامی ئینکاریی)، واتە (پرسیارکردنێکی نکووڵیی لێکەرانە) خوا دەفەرموێ: ئایا پێتان وایە بەگاڵتە ئێوەمان دروستکردوەو، بۆ

لای ئێمە ناگێڕڕێنەوە؟ یەك یەکی ئێمە دەبێ بزانێ کە خوا ئەو پرسیارەی لێدەکات.

بەداخەوە، کە قورئان دەخوێنین، زۆرجار ئایەتێکمان دەکەوێتە بەرچاوان دەڵێین: خوا لەگەڵ هەموومانیەتی و بەگشتی فەرموویەتی، بەڵام نا.. پێویستە هەرکامێکمان وابزانێ، خوا بە تەنیا لەگەڵ ویەتی، وەك (موحەممەد ئیقبالی لاهووریی) دەڵێ: بابم کاتی خۆی ئامۆژگارییەکی کردم، زۆرکاریگەریی لەسەر ژیانم هەبوو، پێی گوتم: ((ڕۆڵە موحەممەد.. کە قورئان دەخوێنی و خوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾،

ئەوە بزانە، کە خوا بەتایبەت لەگەڵ تۆیەتی { موحەممەدی کوڕی فلان! } چونکە تۆ ئیمانداری، ئەدی خوا نافەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئنجا مادام تۆش یەکێکی لەو ئیماندارانە، کەواتە: خوا لەگەڵ تۆیەتی )).

خوا لەم ئایەتەدا ڕوومان تێدەکات، ڕوو لە هەموو بەشەر دەکات، بەئیماندار و بێ ئیمانەوە، دەفەرموێ:

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾ المؤمنون: ١١٥

واتە: ئایا پێتان وایە بە هەوەنتە دروستمان کردوون و، ئێوە بۆ لامان ناگێڕڕێنەوە؟!

کەواتە: زۆر گرنگە ئێمە ئەو پرسیارە (بوونناسیی)یانە بورووژێنین: ئەم بوونە چییە؟ بۆچی دروست بووە؟ کێ دروستی کردوە؟ من چیم؟

لەکوێ هاتووم و بۆچی هاتووم؟ دەبێ چی بکەم؟ ئەو پرسیارانە کە تەنیا (بوونناسیی) جیهانبینیی ئیسلامیی، وەڵامی ڕاست و دروستیان دەداتەوە.

زۆر کەس لەکاتی شارەزاکردنی خەڵك لەئیسلام دا، یەکسەر لە ئیمان و عەقیدەوە دەست پێدەکات، بەڵام لە ئیسلامدا پێش ئیمان و عەقیدە، باسی بوونناسیی (معرفة الوجود) کراوە، چونکە ئیمان و عەقیدە لەسەر ئەو جیهانبینیی و بوونناسییە بنیات دەنرێ، مرۆڤ دوای ئەوەی، کە زانی کەئەم بوون (وجود)ە خوا هێناویەتە دی، وەهەروەها زانی کەئەم بوونە دانراوە، تاکو مرۆڤ تاقی بکرێتەوە، وە مرۆڤ جێ نشینی خوایە، ئەوجار ئیمان بەخوا و، بە فریشتەکانی و، بەکتێبەکانی و، بە پێغەمبەرانی و، بە ڕۆژی دوایی، دێنێ.

ڕۆژێ لەگەڵ بەرپرسێکی ئەم وڵاتەدا قسەمان دەکرد، گوتی: مامۆستا! من زۆر بەئیمانم و، بەینم لەگەڵ خوادا زۆر باشە، زۆریش باوەڕم بە ئیسلام هەیە، بەڵام بەخوا وەك ئێوەم پێناکرێ!

گوتم: بۆچی، ئێمە چیمان کردوە؟ خۆ شێرمان بەگوێ نەگرتوە.

گوتی: بەخوا تۆزێ زەحمەتە ئەو هەموو ئیلتیزامە.

گوتم: باشە یەك پرسیارت لێدەکەم: ئەگەر تۆ برادەرێکت هەبێ، هەموو ڕۆژێ بۆت تەئکید بکاتەوە بڵێ: تۆم زۆر خۆش دەوێ، زۆر دڵسۆزتم، تۆش ڕۆژێك بانگی بکەی و بڵێی: فلان کەس! وەرە ئیشم پێتە، جارێك لە دوای بنێری و نەیەت، بیکەیە دوو جار و سێجار، هەر

نەیەت، دوای ئەوە بڕوات پێی دەمێنێ، کە دڵسۆزتە و، تۆی خۆش دەوێ؟

گوتی: نەخێر.

گوتم: ئەدی خوا عزوجل شەو و ڕۆژ پێنج جاران بانگی ئێمە دەکات، دەفەرموێ: (حيَّ على الصلاة) وەرن بۆ نوێژ (حيَّ على الفلاح) وەرن بۆ سەرفرازیی. دیارە خوا پێویستی بەعیبادەتی ئێمە نیە:

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ ﴾ الجاثية: ١٥.

واتە: هەرکەس چاکەیەك بکات، سوودەکەی بۆخۆیەتی و، هەرکەس خراپە بکات خۆی زیانبارە.

بەڵام بۆچی خوا نوێژی لەسەر ئێمە فەرزکردوە؟ نەوەك ئێمە عەقڵمان پێنەشکێ بچینە خزمەت خوا!

ئنجا بەو بەرپرسەم گوت: ئەدی خوا، چۆن تۆ بە بەندەیەکی باش لەقەڵەم بدات و، لێت بسەلمێنێ کە تۆ ئیمانت بەخوا هەیە؟

ڕۆژێ پێنج جاران بانگت دەکات، بەڵام ڕۆژێك لەڕۆژان وەڵامی بانگەکەیت نەداوەتەوە، هەر بۆ نوێژەکەت، ئەوجار بۆ ڕۆژووەکەت، ئەوجار بۆ خۆپارستن لە خراپە و حەرام؟!

کەواتە: بەڕاستیی، زۆر گرنگە ئێمە ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین: چۆن بچینەوە خزمەت خوا؟!

چیمان پێیە بۆ لای خوا؟

لە حاڵێکدا، کە تۆ دەڵێی: من مسوڵمانم، دیارە ئەگەر کابرا بڵێ: مسوڵمان نیم، دەبێ لە قۆناغێکی دیکەوە لەگەڵی دەست پێبکەی، نەك لە نوێژو طاعەتەوە، کە بەرهەمی ئیمانە.

پێغەمبەر دەفەرموێ: (العهدُ الذي بيننا وبينهم الصَّلاةُ، فمن تركها فقد كفر) رواه أحمد والنسائي والترمذي وقال: حسن صحيح، وصحَّحه الحاكم والألباني.

واتە: ئەو پەیمانەی لەنێوان ئێمە و ئەواندا هەیە، (ئەوان واتە: کافرەکان)، بریتیە لە نوێژ، هەرکەسێ نەیکات، کافرە.

هەروەها فەرموویەتی: (إن بين الرَّجلِ وبين الشرك والكفر: ترك الصلاة) رواه مسلم عن جابر بن عبدالله الأنصاري عن أبيه، واتە: بێگومان لەنێوان پیاوێك و کوفر و شیرکدا، وازلێهێنانی نوێژە.

هەرچەندە زانایان لەو بارەوە مشتومڕ و ڕاجیاییان هەیە، هەندێ دەڵێن: ئەگەر لەبەر تەمبەڵیی نەیکا، کافر نیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە نوێژ دروشم و نیشانەی مسوڵمانەتییە، ئەوجار زەکات و ڕۆژوو و حەج و شتەکانی دی و، خۆپاراستن لە گوناح، هی وا هەیە لە هیچ گوناحێك ناگەڕێتەوە و، حەڵاڵ و حەرام تێکەڵ بەیەك دەکات و، خۆشی بەمسوڵمان دەزانێ!

ئایا تۆ چۆن دەچیەوە خزمەت خوا؟

خوا دەفەرموێ: من قورئانێکم بۆ ناردبووی، وە سوننەتی پێغەمبەر، کە حەڵاڵ و حەرامیان تێدا ڕوون کرابوونەوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ ﴾ الأنعام: ١١٩.

واتە: ( (خوا) هەرچی لەسەری حەڕام کردوون، بۆی ڕونکردوونەوە).

کەواتە: بەر لە هەموو شتێك، چارەسەری قەیرانی ڕووحیی بەوە دەکرێ، کە بگەڕێینەوە بۆ (بووناسیی) و، ئەو پرسیارانە لەخۆمان بکەین و، وەڵامی ڕاست و دروستیان دەست بخەین.

**چارەسەری دووەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی:**

ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەسەر بناغەی بووناسیی (معرفة الوجود) دادەمەزرێ، زۆر کەس، کە عەقیدەکەی لەرزۆکە و بەرگەی پشوە بایەك ناگرێ، بەرگەی تۆزە شەهوەتێك و، برە تەماحێك و هەڕەشەیەك ناگرێ، لەبەرئەوەیە، کە ئیمان و عەقیدەکەی لەسەر بناغەی بووناسیی و جیهانبینییەکی قووڵ دانەمەزراوە، هەروا بەلاسایی کردنەوە (تقلید) و سەرکێڵانە، ئیمانی بەخوا و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و.. هتد هەیەو، ئیمانەکەی سەرزارەکیی و هاکەزاییانەیەو، قووڵ و دامەزراوو ڕیشەدار نیە.

ئیمان بەخوا، ئەوەیە: خوا لەژیانی تۆ دا، لە پێش هەموو شتێك بێ و، خوا (عزوجل) لە عەقڵ و دڵتدا، لە هەموو شتێ بەرزترو خۆشەویستترو گەورەترو لەپێشتر بێ، وەك بۆ خوا ملکەچ دەبی، بۆ هیچ شتێکی دیکە ئاوا ملکەچ نەبی، هەرکاتێ فەرمانێکی خوا لەگەڵ شتێکی دیکەدا تێکگیرا، فەرمانەکەی خوا پێشبخەیت.

بۆ نموونە: پرسیار لە پێغەمبەر کرا: (یارسول الله ! أيُّ الأعمال أفْضَلُ؟ قال: الصلاة على وقتها) متفق عليه.

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا! چ کردەوەیەك چاکترە؟
فەرمووی: نوێژ لەکاتی خۆیدا.

هەیە نوێژەکانی کەمتەرخەمانە دەکات، بۆ وێنە: نوێژ لەکاتی خۆیدا ناکات و دوای دەخات، یان بە پەلەپەل دەیکات و هەڵیدەپڕووزێنێ و، لەڕووی نێوەڕۆکی و ڕواڵەتییەوە، مافی خۆی پێ نادات!

کەواتە: ئەو کەسە، خوای بەرز و مەزنی خستۆتە پەراوێزەوە، فەرمانەکانی خوای پشتگوێ خستوون! بەڵام دەبێ ئەولەوییەت، جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا بێ، ئەوە ئیمان بەخوایە.

هەروەها ئیمان بەفریشتەکان ئەوەیە: تۆ مامەڵەی باش لەگەڵ فریشتەکاندا بکەی، بۆ نموونە: بە ئەندازەی شەرمکردنت لە برادەرێکت، کە گوناهێکی لە بەردەمدا بکەی، شەرم لە فریشتەکانیش بکە! ئەگەر بڕوات بە فریشتەکانی خوا هەیە، کە خوا لە بارەیانەوە دەفەرموێ:

﴿ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ﴾ الإنفطار: ١١.

واتە: (بەڕێزن، نووسەرن، کردەوەکانتان تۆمار دەکەن)، بەڵام نەك بەنووسینی ئاسایی و کلاسیکیی، بەڵکو بەنوێترین شێواز و باشترین ئامێر، کە بەشەر هەر بە تەصەووریشی دا نایەت! ئنجا ئەگەر بڕوات بە فریشتان هەیە، گوناحان مەکە، چونکە ئەو کات و شوێنە، ئەگەر خەڵکیشی لێنەبێ، ئەوا خوا و فریشتەکانی دەتبینن و کردەوەکانیشت تۆمار دەکەن.

وە بڕوا بەکتێبەکانی خوا، ئەوەیە: هەوڵی تەواو بدەی و بەجیددیی تێبکۆشی: کە هەرچی زیاتر: قووڵتر و ڕاستتر لەکتێبی کۆتایی خوا، تێبگەی و لێی شارەزابی و، هەرچی باشترو هەمەلایەنەتریش پێوەی پابەندبی و هەوڵی جێبەجێکردنی بدەی، لەواقیعی ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دا.

وە ئیمان بە پێغەمبەران بەگشتی و سەروەرو خاتەمیان (محمد) "صلی الله علیه وسلم" بەتایبەتیی، ئەوەیە: کاتێ دەگوترێ: ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە، مادام بۆت ساغ بۆوە، کە سوننەتی پێغەمبەرە، ئیدی نابێ تازە هیچ قسەیەك بێنیە پێش.

وە ئیمان بەڕۆژی دوایی، بەوە دەبێ: بە جددیی خۆتی بۆ ئامادە بکەی، کە بەسەربەرزیی بچیەوە خزمەتی خوا (سبحانه وتعالی).

**چارەسەری سێیەم: خوا پەرستییەکی ڕێك و ڕاست:**

وەك چۆن ئیمان و عەقیدە لەسەر بناغەی بووناسیی دادەمەزرێ، خوا پەرستییش بەرهەمی ئیمان و عەقیدەیە، هەتا ئیمان و عەقیدەمان دامەزراوتر و باشتر بێ، خوا پەرستییەکەمان چاکتر دەبێ و، زیاتر تام و چێژ و لەززەت لە عیبادەت دەکەین.

یەکێ لە زانایانمان دەڵێ: پێغەمبەر کاتێ، کە کاتی نوێژ دەهات، دەیفەرموو: (أرِحْنا بها یا بلال![1])، واتە: ئەی بیلال! بەنوێژێ ئاسوودەمان بکە!

ئنجا ئەمە لەکوێ و ئەوە لەکوێ! کە هەندێ لە مسوڵمانانی ئەم ڕۆژگارە دەڵێن: (أرِحْنا مِنها) قوتارمان بکە لێی، یان دەڵێن: با نوێژەکان لەکۆڵ خۆمان بکەینەوە!. وەك ئەوە، کە نوێژ کۆڵێکی قورس بێ بەسەرشانیانەوە، یان کە ڕەمەزان دێ، دەڵێن: ئەوە ڕەمەزان هات! وەك شتێکی ترسناکیان بۆبێ! شایانی باسیشە، کە خوای کارزان و زانا، لە قورئانی بە پێزدا لە زۆر شوێناندا، باسی ئەو چوار پایە

---

(١) المعجم الکبیر، للطبراني ح/ ٦٢١٥.

گرنگ و بنەڕەتییەی کردوە، واتە: چوار دروشمەکانی: (نوێژ، زەکات، ڕۆژووگرتن، حەج و عومرە). وەك لە بارەی نوێژەوە فەرموویەتی:

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤ ﴾ طه: ١٤ .

واتە: وە نوێژ بۆ یادی من بەرپا بکە.

وە لە بارەی ڕۆژووگرتن (صیام)ەوە، دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣ ﴾ البقرة: ١٨٣.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ڕۆژووگرتنتان لەسەر پێویست کراوە، وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێشووتان پێویست کرابوو، بەڵکو پارێزبکەن.

هەروەها لە بارەی حەج و عومرەوە، دەفەرموێ:

﴿ وَأَتِمُّواْ ٱلۡحَجَّ وَٱلۡعُمۡرَةَ لِلَّهِۚ ﴾ البقرة: ١٩٦.

واتە: حەج و عومرە بۆ خوا تەواو بکەن، یان: حەج وعومرە بەتەواویی بۆ خوا ئەنجام بدەن.

وە لەبارەی زەکاتەوە، دەفەرموێ:

﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا .. ١٠٣ ﴾ التوبة: ١٠٣.

واتە: وە لە سامانەکانیان زەکاتێك وەربگرە، کە بەهۆیەوە، پاکیان بکەیەوە و چاکیان بکەی.

هەڵبەتە ئەو چوار بنچینەیە: نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات، چوار دروشمەکانی خواپەرستیین و، ڕاستەوخۆش گرێدراوو پەیوەستن بەئیمان و عەقیدەوە، هەتا ئیمان و عەقیدەمان باشتر بێ، دروشمەکانیش جوانتر و باشتر ئەنجام دەدرێن.

بەڵێ، ئێمە بەو سێ چارەسەرە، دەتوانین خۆمان لە قەیرانی ڕووحیی دەربازبکەین و خۆشمانی لێ بپارێزین.

قەیرانی ڕووحییش شتێ نیە بڵێی: ئینسان هەیەتی یان نیەتی! بەڵکو شتێکی ڕێژەیی و پلە پلەییە و، لەم ژیانی دنیایە پڕ گێرەوکێشەیەدا هەرکەس بە ئەندازەی خۆی قەیرانی ڕووحیی هەیە، چونکە تۆ ئەگەر بەهۆی خۆشتەوە نەبێ، بەهۆی خەڵکی دیکەوە، هەواڵی ناخۆش و تاڵ دەبیستی و، هێندە زوڵم هەیە، هێندە خراپە و لادان و تێکدان هەیە، لەسەر ئاستی زلهێزان و، لەسەر ئاستی ڕژێم و حیزبە حوکمڕانەکانەوە، وە لە سۆنگەی ئەوەشەوە، بەردەوام هەواڵی ناخۆش دەبیستی، کە سەرەنجام ژیانی دنیای پڕ هەوراز و کێشە و تەنگ و چەڵەمەی گورچکبڕ و، پڕ ژان و ئاسۆرو خەفەتباری ئەم ڕۆژگارە، بۆت دەبێتە مایەی قەیرانی ڕووحیی.

ئنجا ئایا چ شتێ تۆ لەو جۆرە قەیرانە دەپارێزێ؟

بە دڵنیاییەوە: تەنیا پەیوەندیی لەگەڵ خوادا، بەتایبەت چینی گەنج ولاوان، پێویستە ئاگادار بن! کە ئێمە لە ڕۆژگارێك داین، بەدەست سەدان نەخۆشیی دەروونیی و فیکرییەوە گرفتارین و، ئەوەی کە لێیان دەمانپارێزێ، تەنیا پەیوەندییە لەگەڵ خوادا، کە لە ئیمان و خواپەرستیدا لەسەر بناغەی بووناسیی ڕاست و دروست بەرجەستە دەبێ.

یەکێ لە پیاوچاکان قسەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ: تۆ تەماشای مانگ بکە، بە هۆی نێزیکیی و ڕەفاقەتی خۆرەوە، هەر چەندە مانگ لە ماددەیەکی کلسیی دروست بووە و، هەر دەتوانێ تیشکی خۆر عەکس بکاتەوە، ئەگەرنا خۆی ڕووناك نیە، کەچی بەهۆی هاودەمیی و هاوەڵیی و نزیکیی لە خۆرەوە، شوعلەوەر و منەووەر بووە!

یەکی دیکە لە عاریفەکان دەڵێ: تەماشا بکە! ئەو هەموو سەگانە لە دنیادا هەن، بەڵام خوا تەنیا باسی یەك سەگی کردوە، ئەویش ئەوە سەگەیە، کە لەگەڵ هاوەڵانی ئەشکەوت (أصحاب الکهف)دا بوو، کە لەبەرەکەتی هاوەڵانی ئەشکەوتەوە، خوا باسی ئەو سەگە دەکات!

مەبەستم ئەوەیە: ئێمە بەهۆی نێزیکییمان لەخوا و پێغەمبەرەکەیەوە، دەتوانین سوودمەند بین، بە ئەندازەی نێزیکییمان، هەڵبەتە هەر کەسێ بیەوێ لە خوا نزیك بێ، دەبێ هەر لە ڕێگای پێغەمبەرەوە بێ:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ آل عمران: ٣١.

واتە: بڵێ: ئەگەر خواتان خۆشدەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشیدەوێن، وە لە گوناهەکانتان دەتانبووری، خوا لێبوردەی میهرەبانە.

بەڵێ، هەر کەسێ بیەوێ بەرەو خوا بچێ، دەبێ بەشوێن پێی پێغەمبەردا بچێ.

ئنجا، با هەوڵ بدەین بەهۆی لە خوا نزیکیمانەوە، خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز بین و، بزانین بۆچی دەژین و چۆن دەژین؟ وە خۆمان لە قەیرانی

ڕووحیی و دەرهاویشتە خراپەکانی بپارێزین، وەك دەرد و نەخۆشییە فیکریی و دەروونیی و ئاکارییەکان، وە لە لادان و خلیسکان و هەڵدێران.

خوا بەلوتف و کەرەمی خۆی هەموو لایەکمان بەو شێوەیە لێبکات، کە لێمان ڕازی بێ و، شایستەی ئەوە بین، کە خوا دەرووی ڕەحمەت و خێرمان لێبکاتەوە، چ لەسەر ئاستی کۆمەڵگای هەرێمی کوردستان و عێراق و، هەموو بەشەکانی دیکەی کوردستان و، چ لەسەر ئاستی ئوممەتی ئیسلامیی بەگشتی، وە خوا یارمەتییمان بدات، کە بەڕاستی خاوەن ئیمان بین، تاکو سەرەنجام باڵادەست و بەرزتربین، وەك فەرموویەتی:

﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ آل عمران: ١٣٩.

واتە: وە ئەگەر بڕوادار بن، ئێوە بەرزترین دەبن.

دواپێداچوونەوە

٥/ربيع الثاني/١٤٣٨ هـ

٣/كانوونی دووەم/٢٠١٧ ز

هەولێر

# پێرستە وشە

# نێوەڕۆك

# نێوەڕۆك

# گەنج و
## قەیرانی ڕووحیی

قۆناغی گەنجیەتیی قۆناغی بنیاتنانی کەسایەتییە، چ کەسایەتییەکی ڕێك و ڕاست و تەندروست، چ کەسایەتییەکی لار و خوارو نەخۆش، (عطاءُاللّٰه)ی ئەسکندەریی کە یەکێکە لە عاریفە گەورەکان، قسەیەکی جوانی هەیە دەڵێ: (مَنْ لَم تَكُنْ لهُ بِدايةٌ مُحرقة، لاتكونُ له نهاية مُشرِقة) واتە: هەر کەسێ سەرەتایەکی گەرم و سووتێنەری نەبێ، کۆتاییەکی ڕۆشن و پرشنگداری نابێ. ئنجا دیارە هەم ئەوەی کە گەنجە، پێویستە ئاگاداری خۆی بێ، هەم دایك و باب و خێزان، دەبێ ئاگایان لە منداڵەکانی خۆیان بێ. لە هەمووشی گرنگتر قۆناغی منداڵییە، پێش قۆناغی گەنجیەتیی، پێویستە ئەو قۆناغەیان بەشێوەیەك بگوزەرێنن کە کەسایەتییەکی ڕێك و ڕاست بنیات بنێن، بۆئەوەی لە هەموو قۆناغەکانی دیکەی ژیانیاندا بەشێوەیەکی ڕێك و ڕاست ڕێبکەن.




**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice


1500 دینار